# ديوانا

# مەلا مەحموود دێرشەوی

## مەلا مەحموود فندی عەبدوڵڵا دێرشەوی

## ١٩٣٩-٢٠٠٤

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن

د. فاخر حەسەن گولی

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکولینێن کوردی

سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

| | |
|---|---|
| پەرتووك | دیوانا<br>مەلا مەحموود دێرشەوی |
| ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن | د. فاخر حەسەن گولی |
| چاپ | ئێکێ/ ٢٠٢٢ |
| دیزاین<br>بەرگ | دیــار عـبـدالله<br>جەگەرخوین جەمیل<br>وارهێل عبدالباقی |
| ISBN | 978-9922-661-02-5 |
| ژمارا سپاردنێ | D- / ٢٦٦٢ / ٢١ |



Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی
zcks@uoz.edu.krd +964 750 471 0863
Iraq- Kurdistan region, Zakho- Univesity of zakho

## پێشەكی

گەلەك جاران دەمێ مرۆڤ هەلبەستێن هندەك هەلبەستڤانان دبينيت كو ب تنێ كيمەكا ئەوانماينە، دلگرانی ل دەڤ مروڤی پەيدا دبيت و ئێكسەر دكەڤيتە هزر و بيراندا و چەندين بۆچی و ژبەرچی د مێشكێ مرۆڤيدا ڕێز دبن، ئەرێ هۆكارێن ژ دەستدانا ئەڤێ چ بوويە و سويجێن كێ بوويە، لێ دەمێ دەست ب خواندنا ژياننامەيا هەلبەستڤانی دهێتەكرن هوكارێ ئەوێ ڕوهن و ئاشكرا دبيت. (مەلا مەحموود دێرشەوی) ئێكە ژ ئەوان هەلبەستڤانان ئەوێن ب دەهان هەلبەستێن ئەوی ژبەر هۆكارێن جودا جودا هندا بووين و ژناڤچووين، ئەگەرێ هەرێ سەرەكی بۆ ئەوان ڕۆژێن ڕەشێن ل سەر مللەتێ كورددا هاتين ب تايبەتی ئەنفالا وێرانكەر كو پتريا هەلبەستێن (دێرشەوی) ژناڤچووينە. ئەڤ بەرهەمێ ل بەر دەستێ مە، ب تنێ بەشەكە ژ ئەوان هەلبەستێن (مەلا مەحموود)ی ڤەهاندين، كو دووبارە ب دەستنڤيسێ خوە نڤيساندين، لێ هەر چ نەبيت مە شيا ئەڤان چەند هەلبەستان كۆم و ژبۆ چاپێ ئامادە بكەين، ئەڤ بەرهەمە ژ چەند جۆرە هەلبەستێن ئەڤينی، سياسی و جڤاكی پێكهاتينە و ل دويڤ ئەوێ ڕێزبەندينا هەلبەستڤانی بەرهەڤكری، بێ كێم و زێدە هاتينە ڕێكخستن.

**ناڤ و ماڵباتا هەلبەستڤانی:**

(مەلا مەحموود فندی عەبدوڵلا)، خەلكێ گوندێ (دێرشەوێ) سەر ب دەڤەرا (بۆتان)، ناڤدار ب (مەلا مەحموودێ دێرشەوی)، ل ساڵا (١٩٣٩)ێ، ل گوندێ ناڤبری چاڤێن خوە ل ئەڤێ دونيايێ ڤەكرينە، ناڤهاتی ل هەر چار بەشێن كوردستانێ ژيايە. وەك: نڤيسكار، زانايێ ئايينێ، هوزانڤان و سياسەتڤان ناڤودەنگيا خوە هەبوويە.

هەلبەستڤان ژ بنەماڵەکا هەری ناڤدارێن جزیرا بۆتانە، وەسا هاتیە زانین کو ل جزیرا بۆتان گرەکێ ئیستراتیجی هەبوویە، کو ئەڤ گرە د ستران و داستانێن جزیرێدا ب (چەپەرێ مام ئیسڤێ دێرشەوی) هاتیە نیاسین، ب ئەڤێ چەندێ ل دەمێ کو میرنشینیا بۆتان کەڤیتە د تەنگاڤی و بەرتەنگییێدا، (مام ئیسڤ) چوویە و چەپەرێن خوە ل سەر گرێ ناڤبری دروستکرینە و بەرەڤانی ژ پایتەختا میرگەها بۆتان کریە و ئەوا د شیاندا دابوویە خەمساری و کێماسی نەکریە. ب کورتی (مەلا مەحموود) ژ نەڤیێن مام ئیسڤێ ناڤدارە.

(دێرشـەوی) ل سـالا (١٩٦٤)ێ، ل گـەل خـانم (عائیشـە مەلا خـەلیـل بـۆتی) خێـزان پێکهینایـە، خـودایێ مـەزن حـەفـت کـورِ (موحـەمـەد عـامر، عـەبدولرەحمـان، حـەسـەن، بـەدرخـان، کـامیران، سـەربـەست و ئـازاد) و کچـەك بنـاڤێ (حـەلیمـا) ب ئـەوان بـەخشیە. ناڤبری ل رێکـەڤتی (٢٠٠٤/١٠/١٨)ێ، بـۆ هەتاهەتایی ژ ئەڤێ جیهانێ مالئاڤایی کریە.

**قۆناغا خواندن و مەلاتیا هەلبەستڤانی:**

هەر ژ دەستپێکێ (مەلا مەحموود)ی حەزا ئەوێ چەندێ هەبوویە کو فێری زانستێ ببیت و ل گەل زانایان و زانست دۆستان روینیت و بەردەوام د پەیوەندیێ دابیت، ناڤبری هەر ژ دەستپێکا ژیێ خوە یێ کێم و هەتا سالا (١٩٦١)ێ، بە مەبەستا بدەستڤەهینانا زانین و زانستێ هاتن و چوونا چەندین دەڤەران کریە و مفادار بوویە، قازانجەکا باش ژ خواندنگەها ناڤدارا (سۆر) ل جزیرا بۆتان ئەوا تایبەت ب زانستێن ئایینی واتە فەقیاتیێ وەرگرتیە، هەروەسا خواندنگەها (کەلێ) ل رۆژئاڤا دیجلەی ژی خواندیە، ل سالێن پێنجیێ ژ سەد سالیا بووری چوویە دەڤ (مەلا عەلی بەرۆشکی) ل گوندێ

(بەرۆژکا سەعدوینی) یا سەر ب دەڤەرا (دۆسکیان)ڤە مفا ژ وانەیێن ناڤبری وەرگرتیە.

پشتی نەهـ سالان ژ خەباتا پێشمەرگایەتیێ، ل سالا (١٩٧٠)ێ، ل خواندنا ئایینی ڤەگەڕیایە، ل پەیمانگەها زانستێن ئایینی ل باژێڕێ دهۆکێ هاتیە وەرگرتن، پشتی ب داوی هاتنا پەیمانگەهێ ل سالا (١٩٧٤)ێ. ل هەمان پەیمانگەهـ بوویە مامۆستا، هەژی گۆتنێە کو پەیمانگەها ناڤبری ژبەر دووبارە ئالۆزبوونا شۆڕەشا ئەیلولێ ل سالا (١٩٧٤)ێ، بۆ باژێڕێ ئامیدیێ هاتبوو ڤەگۆهاستن. پشتی نەکسۆیا شۆڕەشا ناڤبری ل سالا (١٩٧٥)ێ، و ژبەر هەلویستێ ئەوی یێ وەلاتپارێزی بۆ پارێزگەها (سەلاحەدین) هاتی دویرکرن و جارەکا دیتر ل مەلاتیێ زڤڕیەڤە و بەردەوام بوویە. ل سالا (١٩٧٩)ێ، بوویە مەلایێ مزگەڤتا مەزن ل باژێڕێ زاخۆ، ل سالا (١٩٨٧)ێ، جارەکا دیتر بریارا چوونا ناڤ چیا دایە و پەیوەندی ب شۆڕەشا گولانێ (١٩٧٦-١٩٨٨)ێ کریە و بەردەوامی دایە کارێ مەلاتیێ، لێ ل سالا (١٩٨٨)ێ ژبەر ئەنفالا ڕەش پەنابەرێ هەر دوو وەلاتێن تورکیا و ئیرانێ بوویە و هەر چەندە ل کەمپێن پەنابەران بوویە، لێ دەست ژ مەلاتی و وانەگۆتنا فەقیان بەرنەدایە. پشتی سەرهلدانا بهارا سالا (١٩٩١)ێ، ڤەگەڕایایە کوردستانێ و جارەکا دیتر دەست ب کارێ مەلاتی و وانە گۆتنێ کریە. سەرەڕای کو ئەندام پەرلەمان بوویە لێ ل گەل کارێ خوە ل دهۆك و هەولێرێ بەردەوامی دایە مەلاتی و وانەگۆتنێ.

**ڤۆناغێن ئەندامەتیا هەلبەستڤانی د ئێکەتیا زانایێن ئایینی:**

دێرشەوی ژ دامەزرێنەر و بەرپرسێن ئێکەتیا زانایێن ئایینێ ئیسلامێ ل کوردستانێ دهێتە هژمارتن، ب دەستپێشخەریا (مەلا مستەفا بارزانی)

ئێکەتیا زانایێن ئایینێ ئیسلامێ ل کوردستانێ، ل سالا (١٩٧٠)ێ، هاتیە دامەزراندن. (دێرشەوی) ل سالا (١٩٨٧)ێ، ل دەڤەرێن ڕزگارکری بوویە بەرپرسێ لقا دهوك یا ئێکەتیا ناڤهاتی. پشتی سالا (١٩٨٨)ێ، پەنابەری ئیرانێ بووی، ل گەل پەیدابوونا سەرهلدانا بهارا سالا (١٩٩١)ێ، و ئازادیا کوردستانێ ڤەگەریایە کوردستانێ، د چەندین هەلبژارتنێن ئێکەتیا ناڤبریدا بوویە ئەندام و سەرۆکێ ئەوێ. گۆتنا ئەوی یا بەردەوام ئەو بوویە: "نابیت کورد ئایینی بکەنە بار و داننە ل سەر ملێن خوە و بۆ وان ببیتە بارگرانی، بەلکی پێدڤیە کورد، وەك گشت مللەتێن دیترێن جیهانێ، ئایینی بێخنە د خزمەتا نەتەوا خوە دا. ب تایبەتی د کاودانێن سەخت و دژوار دا" واتە ببیتە جهێ مفا وەرگرتنێ.

## هەلبەستڤان و نڤیسین:

(دێرشەوی) هەر ژ زارۆکینیا خوە دەست ب خواندنا هەلبەستێن (مەلا ئەحمەدێ جزیری و ئەحمەدێ خانی) کریە و ب کورتی ئەڤینداری ئەدەب و زمانێ کوردی بوویە. د ژیێ گەنجاتیا خوەدا دەست ب ڤەهاندنا هەلبەستێن کوردی کریە. پشتی ب داوی هاتنا شۆڕەشا ئەیلولێ ل سالا (١٩٧٥)ێ، حکومەتا عیراقێ دکەڤیتە د شەڕێ نەهێلانا زمانێ کوردی و کۆلتۆرێ مللەتێ کورد دا، د ئەڤی دەمیدا (مەلا مەحموود) دکەڤیتە خەباتا بەرەڤانیکرنا زمانێ کوردیدا. د پێشەکیا پەرتووکا خوە یا ناڤدار (مشتاخا چیا) دا دبێژیت: "کول و مەرەق و کەسەر و کەدەر بی، ل سەر دلێ من، کو ئەز پشکداریێ ل ڤی زمانیدا بکەم؛ ب چی ڕەنگێ هەیی بت؛ باشە. چونکی وەکی دبێژن: (هندەك ژ نەیینێ چێترە) و من هزرێن خوە کرن، کا ئەز چی خزمەتێ ژ ئەڤێ زمانیرا بکەم؟ پشتی، وەکی دبێژن: (مام هەمەدان، مە چێل و کول و دەردان، ما نە ئەم و ئەڤ خەبەران)، من تبابەکێ

هزرێن خوە كرن، من بەرێ خوە دایێ: تشتەك وەكی (گۆتنێن پێشیا) هێژا نینە...".

هەژیە بێژین: كو ئێكەم بەرهەمێ (دێرشەوی) پەرتووكا ناڤدارا (مشتاخا چیا ژ گۆتنێن پێشیا)یە كو ل سالا (١٩٨٠)ێ، ل بەغدا هاتبوو چێكرن، لێ چەندین جاران دووبارە چاپ بوویە. هەروەسا خودانێ ئیمتیازا گۆڤارا (دەنگێ زانا) ژ هژمار (٣)ێ، پێدا یا ئێكەتیا زانایێن ئاینێ ئیسلامێ- كوردستانێ، ئێك ژ نڤیسیەرێن گۆڤارێ ژی بوویە.

**ڕۆلێ سیاسیێ هەلبەستڤانی:**

ل سالا (١٩٥٦)ێ، (دێرشەوی) پەیوەندی ب پارتی دیمۆكراتی كوردستان- عیراقێ كریە و بوویە ئەندامێ ئەوێ، ل سالا (١٩٦١)ێ، چوویە د ناڤ ڕێزێن شۆڕەشا ئەیلولێ (١٩٦١-١٩٧٥)ێدا و بوویە پێشمەرگە، ل دەستپێكا شۆڕەشا ناڤهاتی (مەلا مەحموود) ژلایێ مەلا مستەفا بارزانی ب مەرەما دیتنا كەسایەتی و ماقویل و كوردپەروەرێن ڕۆژئاڤایێ كوردستانێ هاتبوو ڕاسپاردن و هنارتن. ل سالا (١٩٦٣)ێ، پشكداری د شەڕێ ناڤدارێ (مەتینی)دا كریە، ل سالا (١٩٧١)ێ، پەیمانگەها كادرێن پارتی دیمۆكراتی كوردستان- خولا دوویێ ب داوی هینایە. ل سالا (١٩٨٧)ێ، پەیوەندی ب شۆڕەشا گولانێ كریە. ل سالا (١٩٩٠) پشكداری د داستانا ناڤدارا (كورێ)دا كریە. ل سالا (١٩٩٢)ێ، هەتا وەغەركرنێ واتە سالا (٢٠٠٤)ێ، ئەندامێ پەرلەمانێ كوردستانێ بوویە.

**چەند تیبینیێن گرنگ ل سەر ئەڤێ دیوانێ:**

هەول ددەین ب تنێ تیبینیێن گرنگ یێن ئەڤێ دیوانێ ڕۆهن و ئاشكرا بكەین و ب كورتی ب ئەڤی شێوەیێ ل خوارێنە:

ـ ئەڤ دیوانا ل بەردەست ژ (١٥) هەلبەستێن ئەڤینداری، سیاس و جڤاکی پێکهاتینە، لێ پرانیا ئەوان ئەڤیندارینە.

ـ (مەلا مەحموود دێرشەوی) د ناڤ هەلبەستێن خوە دا ناسناڤێ (دێرشەوی) بۆ خوە هەلبژارتیە، د دویماهیکا مالکا گشت هەلبەستێن خوەدا، ناسناڤێ ناڤهاتی دووبارە کریە بۆ نموونە وەك:

بەسە دیلبەر ژبۆ یەزدان ل (دێرشەوی) ڤەکە قەیدان

ژ کول و قەهر و خەم و دەردان دل و جەرگێ وی صۆتینە

ـ ب هیچ ڕەنگەکی مە دەستکاریا ڕێنڤیسا هۆزانڤانی نەکریە، ب تنێ د ئەوان پەیڤاندا کو ب شاشیا ڕێنڤیسی دهێنە هژمارتن و کارتێکرنێ ل ڕیتم و واتایا هۆزانێ و چارچووڤێ گشتیێ ئەوێ ناکەت، ڕاستڤەکرن هاتینە ئەنجامدان، بۆ نموونە: (چو- چوو)، (بو- بوو)، (بو- بۆ) و... هتد.

ـ هەلبەستڤان مێژوویا هیچ ئێك ژ هەلبەستان نەنڤیسیە واتە دیار نینە کا هەر هەلبەستەك د کیژ ڕۆژ و هەیڤ و سالێدا ڤەهاندینە.

ـ د ئەڤێ دیوانێدا، پەیڤا (دێلبەر) ژ هەمی پەیڤێن دیتر پتر هاتیە بکارهینان، لێ زێدەباری ئەڤێ پەیڤێ، پەیڤێن مینا (صورگول، شێرین، بولبول و....هتد). بۆ نموونە وەك:

ژ مــن بــاوەربکــە دیلبــەر

ئــەڤینـــدار ب عشـــق و دل

کـو کۆڤـان هـەرو یـەکسـەر

ل بـا مـن کـۆمن وەك بلبـل

ـ تەڤایا هەلبەستێن ئەڤێ دیوانێ بی ناڤونیشان بوون، واتە ب داوی هاتنا هەر هەلبەستەکێ بی ناڤونیشان دەست ب هەلبەستا دیتر هاتیەکرن، هەژی گۆتنێ کو (دێرشەوی) گشت هەلبەستێن خوە ژمارە کرینە، لەورا هەوڵ

هاتیەدان ل دویف تێگەها هەر هەلبەستەکێ و ژ ناڤا هەلبەستێ ب خوە، ناڤونیشانەك بۆ هاتیە دەستنیشانکرن و دانان.

- تەڤایا هەلبەستێن ئەڤێ دیوانی ب شێوەیێ کلاسیك و ب دەڤۆکا جزیرا بۆتان هاتینە ڤەهاندن، لێ د هندەك جهان دەڤۆکا بەهدینان تێکەل کریە، ب خواندن ئەوێ، ئەڤ چەندە ڕۆهن دبیت.

- هەوڵ هاتیەدان هەر پەیڤەکا نە ڕۆهن یان پەیڤێن پێدڤی ب پێناسەکرنێ د دیوانێدا، ب شێوەیەکێ ڕێکوپێك ل پەراوێزان هاتینە نڤیسین.

- کوردستان د هەلبەستێن (دێرشەوی)دا واتەیا وەلاتێ خوەشمێر، عەگید و پەهلەوانان ب کورتی کوردستان ل دەڤ ناڤبری هەمی تشتەکە ل مالکەکا هەلبەستێن خوەدا وەها دبێژیت:

دڤێـت کـۆ ئـەم گشـی ڕابـن
وەلاتـــێ مـــە کوردســـــتان
دا ژبـــن زوڵمـــێ ڕزگـــار بـــن
ئــەڤ عــەگیـد و پــەهلــەوان

- ئێکگرتنا کوردان ل دەڤ (دێرشەوی) ڕامانا خوە یا گرنگ هەیە و هیڤی و ئومێدا وی ئەو بوویە کو کورد ببنە ئێك و هەڤدوو بگرن د مالکەکێدا دبێژیت:

گـــەلـــێ کـــورد دە ڕابـــن
پێکڤـــە بکـــن خـــەباتـــە
هـــەمـــی ڤێگـــرا تـــەبـــابن
بـــەس بمیـــنن ل عـــــەردان

- هەلبەستڤانی د نڤیسینا خوە دا وەك گەلەك مەلایێن هەلبەستڤان، پیتێن عەرەبی تێکەلی پەیڤێن کوردی کرینە مینا: صۆڕ (سۆر)، صاڵ (ساڵ)،

طۆپ (تۆپ)، طاری (تاری)، صووند (سووند)، و... هتد. مە دەستكاری د نڤیسینا ئەواندا نەكریە وەكی خوە هێلاینە.

ب داوی هاتنا ئەڤی كاری، سوپاسیا خودایێ مەزن دكەین كو هێز و شیان داینە مە ئەم ئەڤێ دیوانێ ب داوی بینین، هەروەسا سوپاسیا نڤیسكار مامۆستا (موحەمەد عامر)ێ كوڕێ هەلبەستڤان (مەلا مەحموود دێرشەی) دكەین كو هەر ژ دەستپێكا كاری هەتا دویماهیێ هاریكار و پشتەڤانێ مە بوو، دیسان سوپاسیا هەمی ئالیان دكەین، هیڤیدارم ئەڤ كارە ببیتە جهێ مفا وەرگرتنا هەمیان.

د. فاخر حەسەن گولی

دهۆك ٢٠٢١

# ژ من باومر بکە دیلبەر

ژ من باوەربکە دیلبەر
ئەڤیندارم ب عشق و دل
کو کۆڤان هەرۆ یەکسەر
ل با[1] من کۆمن وەك بلبل

ژ کۆڤانا دنالم ئەز
وەکی فندێ[2] دصۆژم[3] ئەز
وەکی بلبل[4] دکالم[5] ئەز
گاڤا ل من بەرزە بت صۆرگول[6]

گاڤا صۆرگول ل من نە دیار بت
چ رەنگ دێ من خوەشی ل کار بت
خەو و خوارن دێ وەك مار بت
ژبەر وێ لەعلا ڕوی صۆرگول

---

(١) ل دەڤ، ل نك، ل جەم.
(٢) وەك شەمالکێ ڕۆناهیێ ددەت.
(٣) سۆژم.
(٤) د گەلەك جاراندا بولبول نڤیسیە.
(٥) دنالم.
(٦) سۆرگول

ئەوە لەعل[١] و دوڕ و یاقۆت[٢]
دل و جەرگ و هناڤ ل من صۆت[٣]
وەرە ئەی دۆست دا ئەم ببین جۆت
کول و دەردا ڕاکین ژ سەر دل

وەرە دا ئەم کولا ڕاکین
گول و بلبل بهەڤ شاکین[٤]
برینا ب ڕۆندکا ساخکین
مە ئیژمارتن[٥] برین بوون چل

برینێن من بێ ئێژمارن
ب عەجێب ژانن پڕ غەدارن[٦]
ل من ژەحرە[٧] خەو و خوارن
چڤاتا تە ل من بی کول

چڤاتا تە کولە ل با من
تو وی خەون و خیالا من
ئەڤینا تە ئومێدا من
ل ئەسیرێ خوە ڤەکی تو دل

---

[١] یاقۆتێ سۆر.
[٢] بەرێن گرانبها.
[٣] سۆت.
[٤] شاد بکەین.
[٥] هژمارتن.
[٦] بێ ئەختوبار.
[٧] ژەهر.

بەسە دیلبەر ئەڤێ خەشمێ[1]
ل (دێرشەوی) بکە ڕەحمێ
دەرینە وی ژبن زۆڵمێ
ژ کول و دەردا ل وی بی سل

[1] خوەمەزنکرن، دفن بلندکرن.

# ئەو دیلبەرا من دل ل بال

ئەو دیلبەرا من دل ل بال[١]
هات و سەلاڤ ل من کر، کەنی
پڕ کر ل من دەرد و خیال
کر: ئەڤ سوئال[٢] و سەکنی[٣]

پرسیا ژ تە ئەی بلبلێ
خۆن بوو ب جەگەر ژ دەردێ ئەڤینی
ئا تە[٤] صەبرە چێ بوویە
یا هێژ تو دل کول وەك منی

حازر ددامن ئەڤ جەواب
دل خەبتی[٥] ب رەنگێ ڕەباب[٦]
حاجەت[٧] نیە صووندێ[٨] بخۆم
چونکی ئاگەهدار ب منی

صووندێ دخۆم ب ڕەش ئەبرووا[١]

---

[١] ل دەڤ، ل نك.
[٢] پرسیار.
[٣] راوەستیا.
[٤] یا تە.
[٥] تێکهەلکرن.
[٦] عەورێ سپی.
[٧] پێدڤی.
[٨] سووند، سویند.

خەمە نەما شبهێ[٢] رووا
لەو کۆمە دل بێ پارە پار[٣]
چونکی تو خوەش کێرا منی

دل ل من دنالت ڕەنگێ چەنگ
جەرگ و هناڤ ل من پۆڕەنگ[٤]
تەشبیهێ[٥] فەرهاد[٦] دل بکول
چونکی شێرینا منی

شێرین توی فەرهاد ئەزم
ژ دەردێ ئەڤینا تە دگەزم[٧]
ب وان هەر دوو لام و عەینا
ل ناڤ زانم تو خوەش زینا منی

تە دین کرم شبهێ مەمێ[٨]
دەرد ل من جڤینە[٩] د هەر دەمێ
گۆ[١٠] (دێرشەوی) بەس تو بنال
زانم ئەڤینداری منی

---

[١] بری، برە.
[٢] مینا، وەك.
[٣] پارچە پارچە، پرت پرت.
[٤] ئاگر، پێتە.
[٥] مینا، وەك.
[٦] فەرهاد یارێ شیرینێ، داستانا ناڤدارا بناڤێ (فەرهاد و شیرین).
[٧] دنالم، دئێشم.
[٨] مەمێ ئالان دەزگرێ زینێ، داستانا ناڤدارا بناڤێ (مەم و زین).
[٩] کۆم بووینە، خرڤەبووینە.
[١٠] گۆت.

# شرینا لێف شەکر

وەی دیلبەرێ وەی دیلبەرێ
وەی شێرینێ لێف شەکرێ
ئەڤ ئاگرێ ل جەرگێ مدا
ما جارەکێ نا ڤەمرێ

دیلبەر تووی، دلدار ئەزم
صۆرگول[1] تووی، بولبول ئەزم
کەیفخوەش تووی، دل کول ئەزم
ڕەحمێ ببە، ئەی سەروەرێ

ڕەحمێ ببە ئەی نازەنین[2]
فەرموو وەرە حالم ببین
جەرگ و هناڤ ل من بوونە خوین
وەی دل ڕەقێ دل کافرێ

وەی دل ڕەقا ژ ڕەنگێ بەرا
بەس من بدە ل بەر خەنجەرا
من دل نەما ژبەر کەسەرا[3]
ما ژ خوە تو نا بێژی ئەرێ

دەرد و کەسەر پوڕ[1] بوون ل بال[2]

---

(١) سۆرگۆل.
(٢) نازدار.
(٣) کول و کۆڤان.

کەیف و خوەشی ل من بوون خیال
ئەز بوومە کوردەك بێ هەڤال
وەی کوردستانا ب گەوهەری[٣]

کوردم، کوردستانا منی
شێرین و هەم ژینا منی
هەم دەشت و زۆزانا منی
دی دژمنان ژێ کەم دەری

بۆ دژمنان ئەس[٤] ڕێگرم
ئەو دەستێ بێ تە دی بڕم
ل سەر سینگێ تە باڵەفرم[٥]
وەی شێرینێ موعتەبەری[٦]

سینگێ تە مەیدانا منە
هەم باغ و بویستانا منە
جهێ گەشت[٧] و جەژنا منە
ڕوی صورگولێ، دیم گەوهەری

گوت: (دێرشەوی) ئەز یا تەمە

---

[١] پڕ، گەلەك، مشە.
[٢] ل دەڤ، ل نك، ل جەم.
[٣] تشتێن گرانبها.
[٤] ئەز.
[٥] باڵندە تەیر.
[٦] جهێ بها و گرنگیێ.
[٧] سەیران.

ئــەز كــۆز و پاوانــا[1] تــەمــە
بــەنــدەوارا[2] ســۆزا تــەمــە
ب صــۆند و ســۆزا مێــرێن بــەرێ

---

[1] پێژان.
[2] ب رێ، بێچارە.

## شەڤ تا سەحەر دنالم

دیلبەر بەرامبەری من سەکنی،[١] من بچاڤا
ئیشارەتکر و گۆتێ باری[٢] ل تە بکت سەلاڤا
ژ من پرسیارکر و گۆت: بۆ هەر دەمی شکەستی
من گۆ:[٣] دیلبەر تو زانی من دەست و پێ دداڤا
تیرا کەڤانێ بورهێن[٤] تە ئەز کرمە موشەوەش[٥]
شەڤ تا سەحەر[٦] دنالم من ئاخ ۆ ئۆخ ژ هناڤا
دنالم ئەز شەڤ و ڕۆژ وەکی بولبول ژبۆ گول
ئێش و ئەلەم مە پوڕ[٧] بوون ل مە بی ژانا زراڤا
ئەڤینا تە شەپالێ[٨] کرم مەجنوون[٩] و بێ کەس
تو خیالا ل دلێ من ل هەمی ساعەت و گاڤا
داخوازا من ژ تە ئەو بدی ل من تو دەستوور
داکو ببوسمە[١٠] ئەز گەردەن و لێڤ و چاڤا

---

[١] ڕاوەستیا.
[٢] خودایێ مەزن.
[٣] من گۆت.
[٤] بری، برهـ.
[٥] ئالۆز.
[٦] سپێدێ.
[٧] پڕ، گەلەك، مشە.
[٨] جوان، شۆخ، شەنگ.
[٩] دین، شێت.
[١٠] ماچی بکەم.

بکـن بـەرامبـەری هـەڤ سـمبێل و جـووتێ سـێڤا
بکین کەیف و جڤاتێ وەکی دوو بەرخێن ساڤا
دگۆ[1] ئەی (دێرشەوی) بەس بنالە تو ژ دلێ کول
یادیگارم[2] ژبۆ تە ب شکلێ[3] بووك و زاڤا



---

(1) د گۆت.

(2) (یادگار) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (بیرهاتن) ددەت.

(3) ب ڕەنگێ، ب شێوێ.

# صۆرگولا هەیڤا گولانێ

دیلبەرا کو من حەباندی[١] هەر وەکی ستێرا گەشە
من ژبەر وێ دل کول و ب ئاهـ و کۆڤان و نەخوەشە
دل برینداره ژبەر تیرا کەڤانێ ئەبرووان[٢]
زلف[٣] و خال ل من بین تەشابەت[٤] جه ل من بی ئاتەشە[٥]
ئاتەشێ مووسایە تیرا کو ل من دا دیلبەرێ
ئەو برینن کول دل بووین دبن شێست و شەشە
صۆرگولا هەیڤا گولانێ من هەیە هویڤی ژ تە
جارەکێ تو من بخوازی ل صوحبەتێ[٦] یان تو ب مەشە[٧]
(دێرشەوی) هەردەم مە ڕەڤ کێشە ببۆست[٨] دیلبەرێ
دا بکت قوربان و گووری ئەو ڕۆح و جان و لەشە

---

(١) حەواندی، جهێ دایێ.

(٢) (ئەبرو) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (بری - برە) ددەت.

(٣) بسك.

(٤) بێسەروبەر.

(٥) (ئاتەش) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (ئاگر) ددەت.

(٦) سوحبەتێ.

(٧) ڕێڤەچوون.

(٨) ماچیکرن، ڕامیسان.

# ئەز بریندارم

ئەرێ دیلبەر ژبۆ یەزدان دلێ من بەس تو بشکینە
تو زانی ئەز بریندارم برینێن من نە هەڕشینە
کول و دەرد و خەما هەردەم دل و مێلاك ل من سۆتن
ژ من باوەر بکە دیلبەر ژیل[1] تە من ئومێد نینە
مە زانی تو ئەڤینداری وەکی من دل برینداری
بەلێ دەرکەت وەکی ماری، تە بەخت و ئینصاف[2] قەت نینە
تە گۆت بۆ تە خوەش هەڤالم ل ژینا تە وەك شەمالم[3]
تە نە گۆت ئەز کەڕ و لالم؛ مە گری و گازند گولێ[4] نینە
بەسە دیلبەر ژبۆ یەزدان ل (دێرشەوی) ڤەکە قەیدان
ژ کول و قەهر و خەم و دەردان دل و جەرگێ وی صۆتینە[5]

---

(١) ژیلی.
(٢) وژدان.
(٣) شەمالك.
(٤) گوه لێ.
(٥) سۆتینە.

# باوەریکە دیلبەر

دیلبەر باوەریکە دەما کو ئەز تە نەبینم
بێ سەودا[١] و دینم
شەڤ تا سەحەر[٢] ئەز کول و دەردا د جڤینم
چونکی دلبرینم
دەرد و کەسەرا جەرگ و هناڤ ل من کر پار پار
ئەز مام بێ کەسوکار
وەك کوردەك پەریشان و بەلەنگاز و بێ سەردار
رێکا د کورینم
بووراندن مە چەند صالً[٣] و زەمان ب ژار و بەلەنگاز
ئازادی مە داخواز
ئومێدا مە رزگار ببین دا بژین ب سەرفراز[٤]
دەردا ڤەرەڤینم

---

[١] تێکچووی.
[٢] سپێدێ.
[٣] سالً.
[٤] سەربلند.

# ئەڤینداری

ئــەرێ دیلبــەر دە کــا بێــژە ژ بــوچی تــو ل مــن نــە دیــاری

تــە ئــەڤ دنیــا خــوەش و شــێرین ل مــن کــر دۆژەهــەک[1] طــاری[2]

حــەتــا کــەنگــی بیــنم ئــەز د بــەنــدا ســۆز و پــەیمانــا

ئــەڤــە رۆژا مــە بــی نیڤــرۆ، نــە مــا بێــت چــاخێ ئێڤــاری

مــە بوورانــد ســە و چــار صــالّ[3] د رێکــا بــورج و ئــالایێ

ژ نــوو[4] پێڤــا دبێــژن مــن غــەریبــی ل ڤــی جهــواری

ئــەگــەر ســاخبم[5] ئــەمیــر و شــێخ و قــازی ببیــنم ل گــەل خــوە

ل بــا[6] ســەیــدا ل ســەرایــێ ئــەم بــبن مێهڤــان ب رزگــاری

جــەواب و کاغــەزا رێکــین دگــەل خــانی[7] بــلا کــۆم کــت

جــەزیــر[8] و میــر عیمــادەدیــن[9] دگــەل وان پــەرتــووێ هــەکــاری[10]

(فــەقــی ســەیــد)[11] (حــەریــر)ێ[1] تــو ب نالیــنــە وەکی(نــالی)[2]

---

[1] دوزەخ.

[2] تاری.

[3] سالّ.

[4] ژ نوکە، ژ نهۆ.

[5] ل جهەکێ دیتر: مە گۆ بەلکی.

[6] ل دەڤ، ل جەم، ل نك.

[7] ئەحمەدێ خانی (١٦٥٠-١٧٠٧).

[8] مەلایێ جزیری (١٥٧٠-١٦٤٠).

[9] ئێك ژ میرێن میرگەها بوتان بوو.

[10] پەرتووێ هەکاری هەلبەستڤانێ ناڤداری دەڤەرا هەکاریان.

[11] فەقیێ تەیران (١٥٩٠-١٦٦٠).

(جەگەرخوون)[3] بۆ وەکی (نالبەند)[4] ل مە ژین بۆ وەکی ماری

(شڤان)[5] بێژە کوری (شێخۆ)[6] تو قانون[7] و نەیێ بینە

(سەعید ئاغا)[8] ل جزیرێ تو رووبارێ کەلها گاباری[9]

تە گۆت بۆ تە ئەڤیندارم ب رەنگ و زین و شێرینێ

حەتا بووم بلبلەك شەیدا[10] ژ نوو دبیژی سازگاری[11]

وەرن دا هوین کول و قەهر و خەم و دەردا تەڤا ڕاکن

خوەشی و شاهی ل وەلاتێ مە سەرانسەر بت ب یەك جاری

د گۆڤەندا من و دیلبەر نەمینت ژاری و برسی

حەتا کەیفخوەش ببم تا کو دگەل یارێ بکم یاری

دەما ژ برجا ئەڤینیێ تێم حەمی پێکڤە ب یەك دەنگی

بێژن (دێرشەوی) ب ڕاستی ئەڤینداری، ئەڤینداری

---

(1) عەلی حەریری (١٤٢٥-١٤٩٥ز).

(2) مەلا خدر شاویسی میکایلی ناڤدار ب نالی (١٧٩٥-١٨٥٥ز).

(3) جەگەرخوین (١٩٠٣-١٩٨٤).

(4) ئەحمەدێ نالبەند (١٨٩٠-١٩٦٣).

(5) شڤان پەروەر سترانبێژێ ناڤدار.

(6) موحەممەد شێخو سترانبێژی بەرنیاس.

(7) قانون ئالەتەکێ موزیکێیە.

(8) سەعید ئاغا ستران بێژێ مللی یێ ب ناڤودەنگ.

(9) کەلها گاباریێ دکەڤیتە دەڤەرا جزیرا بوتان.

(10) ئەڤیندار، دین، شێت.

(11) گونجای.

# وەڵاتێ من كوردستان

ئەز كوردم موسلمانم
وەڵاتێ من كوردستان
شۆڕەشگێرەك جوانم
ئەز عەگید و پەهلەوان
سەروەرێ من پێغەمبەر[١]
وەڵاتێ من كوردستان
هەر ئەوە بۆ مە رێبەر
ئەز عەگید و پەهلەوان
سەربازێ دۆزا ویمە
وەڵاتێ من كوردستان
بۆ رێكا وی گووریمە
ئەز عەگید و پەهلەوان
دڤێت كو ئەم گشی[٢] ڕابن
وەڵاتێ مە كوردستان
دا ژبن زوڵمێ رزگار بن
ئەڤ عەكید و پەهلەوان
ئامانجا مە دڤێت سەلام بت
وەڵاتێ مە كوردستان
داكو ژین ل مە تەمام بت
ئەز عەگید و پەهلەوان

---

(١) موحەمەد پێغەمبەر (س).
(٢) گشتی، ب هەڤڕا، پێكڤە.

(دێرشـــــــەوی) دلبــــــرینم
وەلاتـــێ مـــە کوردســـتان
تـــم ب قیـــر و نـــالینم
ئـەز عـەگیـد و پـەهلـەوان

# چەرخ ل مە خوەهر[١] و ڤاژیە

ساقی[٢] تو ژبۆ خودێ بلەزینە
هندەك ژ مەیا صافی[٣] تو بینە

هەر چەند مە حاجەت[٤] نیە ب شەرابێ[٥]
چونکی ل مە ڕۆنە ب ڕەنگێ کتابێ

ئەما دا وەکو ئەز ژی ببێژم
هەر چی ل دلێ خوەدا بڕێژم

مینا مەزنێ مە شێخێ خانێ[٦]
وی هەسپێ بەلەك بەردا مەیدانێ

پۆر پۆرێ[٧] بکەم ب دل صەدا ژی
ژ ڤێ چەرخا ل مە تەم[٨] خوەهر و ڤاژی

پرسیارا مە هەردەم ژ لەولەبا چەرخ
تا کەنگی جیران ل مە گور[٩] بن ئەم بەرخ

---

(١) خوار.
(٢) ئەوێ شەڕابێ دگێڕیت.
(٣) سافی و زەلێل.
(٤) پێدڤی.
(٥) عەرەق.
(٦) ئەحمەدێ خانی (١٦٥٠-١٧٠٧).
(٧) گازندە ڕەوشا خوە بکەم.
(٨) هەمی، گشت، تەڤا.
(٩) گورگ.

سـكين[1] و چـەقـۆ ل سـەر صطـۆێ[2] مـە
هـەر كـەس بـەرێ وی ل خارنـا گۆشـتێ مـە

هـــەردەم وەكـــی هـــرچ و گـــور[3] نـــەباشـــا
هـەسـتیا ل مـە ڤـەهێـرن تـم[4] وەكـی ئاشـا

قانۆنـــا وان ل ســـەر مـــە ڕێلســـتان[5] بـــت
ڕویڤـــی ژبـــۆ وان ل مـــە فـــەرمانـــدار بـــت

هەر تووی بەرخێ ل بەر كێرێ ژبۆ ڤان دژمنان
حەبس و زێندان و ستەمكاری ل سەر تە زێدەیە

---

[1] كێرك، چەقوك.
[2] ستۆێ.
[3] گورگ.
[4] گشت، تەڤ.
[5] دارستان.

# بۆچی وەلات مایە پارچە پارچە

ئــەی وەلات نــێ تــو دزانــی دەردەك مــن پــوڕ هــەیــە
دۆز[١] و داخـوازا مـە هـەردەم ب سـەربخـوەبوونـا تـەیـە
بـۆچی مـای پارچـە پارچـە حـەتـا ئیـرۆ چـار کـەنـار[٢]
کوژتن و تـالان و صۆتن[٣] جـەنـگ و شـەر بـەهـرا تـەیـە
ئەڤ دوو صەد صالێن[٤] کو تۆ مایی بن دەستێ نـەیار
هیچ بەگ و ئاغایێ خوینمێژ قەت نە خێرخوازێ تەیە
ئـەڤ بـەگ و ئاغانـە یـەکسـەر تـۆ سـپارتی[٥] دژمنـان
گەهـ[٦] ب مێزی[٧] ئەو دخون مالێ تە یان ب گازندەیە
ماچیـە کـۆ جـارەکـێ تـو ژی ب سـەربـەسـتی بـژی
حـەیـف و تـۆلا خـوە تـۆ بسـتینی ژ خـوینمێژی خـوەیـە
(دیرشـەوی) هـەردەم دنـالێ وەك جـەگـەرخوین، دلبـرین
ئـەو پـەریشـان و بـەلـەنگـاز تـم کۆڤـەنـداری تـەیـە

---

[١] کێشەن پرس.
[٢] ئالی، لا، ڕەخ.
[٣] صۆتن.
[٤] سەد ساڵ.
[٥] ڕادەستکری.
[٦] ئەگەر.
[٧] بنێری، سەحکەیێ.

## گەلێ کورد دە ڕابن

ئەی هەڤالێن دلۆڤان
باوەر بکن ژ یەزدان
هەر ئەزم یێ کۆلوڤان
ل سەر خاکێ کوردستان

مە گۆ[1] بەلکی ببینم
دەرمانەکی ژ کولا ڕە
برینا پێ بکەوینم
بەلێ ل من بوویە فەرمان

مە گۆ[2] ئەمێ بستینن
دەشت و چیا ب جارەك
ئالا کوردی بهەژینین
پاشی مە زۆزان ل دەردان

گەلێ کورد دە ڕابن
پێکڤە بکن خەباتە
هەمی ڤێگرا[3] تەبابن[4]
بەس بمینن ل عەردان

---

(١) مە گۆت.
(٢) مە گۆت.
(٣) هەڤڕا، پێکڤە.
(٤) ئارام، هەدار.

ڤايه هاته مەيدانێ
خۆرتێ كوردێ قەهرەمان
رۆژا جەنگ و لێدانێ
نەفەر حەمزێ پەهلەوان[1]

وەلاتێ خوە بستينه
تو جارەكى ب تەمامى
نەيارا ژێ دەرينه
پاقژ بكە كوردستان

نەيار يێ تە يێ عەول[2]
هەمى بەگ و ئاغانه
بكوژە ژ وان شيست و چل
ژبۆ دل هەر ئەو دەرمان

هندەك هەنە ژ وان ژی
خودان رەحم و ب خێرن
ئەو ژی فەقير دژی
ب دل دبێژن ئەم موسلمان

(ديرشەوی)تەم دنالی
ژبەر ئێشا برينا
هەردەم بقير و كالی[3]
كانی وەلاتێ كوردان

---

(1) مەبەست ئیمام حەمزە مامێ پێغەمبەری (س) ئەوێ ل شەڕێ (ئۆحدێ) شەهید بووی.
(2) ئەوەل- ئێكێ.
(3) گازی، هەوار.

# بەس بگری

دوهوی[١] نیڤرۆ ژ بەری نڤێژا ئێڤاری
م[٢] جەحشەك دی سپی ڕەشێ طاری[٣]
م گۆ[٤] چ دکی ل ڤرِ[٥] ئەی جەحشێ نازان[٦]
ظڕی گۆ[٧] ئەز د گەڕم ل طایێ قێڤاری[٨]
م گۆ[٩] ئەی ئەرێ تەنی ژ بۆچی
د چی و تێ، د گەڕهی ل بەر ڕوبیاری
ئەرێ ما ناکی پاکی ژ دوژمنێ خوە
وە خورت و ژبوونا[١٠] خوە نەیاری
تۆ نابینی ل دۆر تە ل دەر نەوالێ[١١]
کو چاوا گورگا گرتیە ب چار کەناری[١٢]

---

[١] دوهی.
[٢] من.
[٣] تاری.
[٤] من گۆت.
[٥] ل ڤێرێ.
[٦] نەزان.
[٧] زڕی گۆ.
[٨] تایی ڤێڤارێ یان داڤا ڤێڤارێ، ڤێڤار ناڤێ گیایەکیە و ل وەرزێ بهارێ شوین دبیت.
[٩] من گۆت.
[١٠] توشبوون.
[١١] نهال، دۆل.
[١٢] ئالی، رەخ.

دگۆ[1] ئەڤ گورگێن هە ڕاست ل من نەیارن

بەلێ ژ من پێدا هەنە جەحشێن سێ صالی

م گۆ[2] ئەی کەر ژ تە جەحشتر ئەڤ چ تەبانە

دگۆت حەچی خائن و بفروشێن ڤی واری

م گۆ[3] ئەی جەحش هەمی ئاغا وەسانە

دگۆتە من پوڕێن[4] وان ئەهلێ پاری

م گۆ[5] ئەی تو نابێژی ژبۆ وان

کۆ بێنە دەر ژبن بارێ نەیاری

د گۆتە من چیە ل من بووی جەگەرخوین

ژ صبها[6] ل من گازندە تا ئێڤاری

ئەرێ دەردێ کەرا ما تو نزانی

ل با[7] صۆرگول نە ب یەک گا قیڤاری[8]

بەگ و ئاغا چ زانن قیمەتێ کورد

وا کوردستان سپارتیە[9] بۆ نەیاری

حەچی گاڤا ژ وان ڕە بێتە فیتەک[10]

ئەوێ هەر تشتی بدنە ب یەک دیناری

---

(1) د گۆت.

(2) من گۆت.

(3) من گۆت.

(4) پتریا ئەوان، پڕانیا ئەوان.

(5) من گۆت.

(6) سپێدەهیا.

(7) ل جەم، ل دەڤ.

(8) تایێ (داڤەکا) گیایێ ڤیڤارێ.

(9) ڕادەستکرن.

(10) فیتک لێدان، واتە ئاگەهدارکرنێ.

م گـوْ[1] ئـەی جـەحشـی خـودێکی[2] بـەس بێـژە
تـــە جـــەرگـــێ مـــن ژ دل کـــر پـــاری پـــاری
د گـــوْ[3] ئـــەی (دێرشـــەوی) بـــەس تـــوْ بنالـــە
تـــوْ بـــەس بگـــری ب قیـــرین و هـــەواری

---

[1] من گۆت.
[2] تە ب خودێ ددەمە سویندێ.
[3] د گۆت.

## بەس بنالە ئەی كورد

بەس تو بنالە ئەی كورد بووی دەنگێ خوەیێ ژار
پەهیز[1] ل تە خلاس بی ڤایە ل تە بی بهار
هشین بۆ ئەو دارا كۆ تە ئاڤدای ب خوینا خوە
پێژان[2] بكە و بحەمینە[3] دا هشك نەبی وەك هەر جار
فێكیێ[4] خەباتا تەیە رۆژا یازدەی ئاداری[5]
وەلاتێ خوە ئاڤاكە ژیركە تو پارو پێرار
كوردستان تە ئازادكر ب خوینا لاشێ[6] شەهیدا
طۆپ[7] و قەلەم بهەڤرا دگەل خۆهدانا جۆتیارا

---

[1] پاییز.
[2] تان، دیوار.
[3] بپارێزە، چاڤ خوە بدەیێ.
[4] فێقی، مێوە.
[5] مەبەست بەیانا (١١)ێ، ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ.
[6] كەلەخ، تەرم.
[7] تۆپ.

# پارتی[1] و بارزانی[2]

ئەی ئادار زانم جەژنا کوردانی
ب خوینا خۆرتێن خوە مە تو دەرئانی
زانین حزبا بەعث باش تازەنبی
کو خوەش هەڤالی پارت و بارزانی

ژ بەری کو تو بێ ل سەر کوردستانێ
بمبە دبارین وەکی بارانێ
لێ مللەتێ کورد وەکی ل سەیرانێ
چونکی وی هەبی پارت و بارزانی

هەڤالا ژبیر نەکن کوشتیێن ل گۆرستان
خوە کرنە گۆری ژبۆ کوردستان
دا وەلێت دەرخن ژبن پێ و دەستان
ب هاریکاریا پارت و بارزانی

دایکا شەهید هەرە بلەزینە
کوشتیا ب جارەك تەڤا بجڤینە[3]
بێژە کورێ ئەم نەیی خوەینە
ڤایە مە هەیە پارت و بارزانی

---

(١) پارتی دیمۆکراتی کوردستان، ل (١٦ ئاب ١٩٤٦)ێ، ب هلبژارتنا مەلا مستەفا بارزانی وەك ڕیبەر هاتە دامەزراندن.

(٢) مەلا مستەفا بارزانی ل (١٤ ئادارا ١٩٠٣)ێ، ل گوندێ بارزان هاتیە سەر دونیایێ ب ناڤدارترین و مەزنترین ڕێبەرێ تەڤگەرا ئازادیخوازا کورد دهێتە هژمارتن، گرنگترین خال د ژیانا بارزانیدا چوون و زڤرینا وی ژ ڕووسیا (١٩٤٦-١٩٥٨)ێ، و ڕێبەریا شۆڕەشا ئەیلولێ (١٩٦١-١٩٧٥)ێ بوو، ل سالا (١٩٧٩)ێ، مالئاڤایی کر.

(٣) کومکرن، خرڤەکرن.

بـــژی هـــەڤـــالێ مـــە ئـــەحمـــەد بـــەكـــر[١]
ب ڕاســـتی دلـــێ مللـــەت ل خـــوە خـــوەشـــكر
یـــــازدەی ئـــــاداریێ تـــــازە وی دەركـــــــر
ب ئاریكاریــــــــا[٢] پــــــــارت و بــــــــارزانی

(دێرشـــەوی) نـــەگـــری مللـــەت شـــیار بـــوون
دەمێن تارِ و تەنگ[٣] كۆ مە دین[٤] ڤا[٥] چوون
ڕێكـــا ژینـــا خـــوە وی گـــرت و ڤـــا[٦] چـــوون
ل پێشـــــــیا وی پــــــــارت و بــــــــارزانی

---

[١] ئەحمەد حەسەن ئەلبەكر، دناڤبەرا سالێن (١٩٦٨- ١٩٧٩)ێ، سەرۆك كۆماریێ عیراقی بوو.
[٢] هاریكاری، هەڤكاری.
[٣] مە ڕۆژانێن نەخوەش و پڕی تەنگاڤی دیتن.
[٤] دیتن.
[٥] ئەڤە.
[٦] ئەڤە.

-١٠-

ئەی وەلاتێ تۆ دزانی دەردەکێ سپۆر هەیە
دۆژنۆ داخوازا مە هەردەم د سەر بخوە بۆ نا تە یە
بۆچی مای پارچە پارچە حەتا ئێر و چاکە نار
کوژتنۆ ئالان و صوتن جەنگێ و شەرپە هراتە یە
[illegible] بەستی بڕژی
[illegible]
ئەڤ دوصەد صالن کۆ تۆ مایی لبن دەستێ نەیار
هیچ بەگۆ ئاغایێ خوین میرژ قەت نە خێرخوازێ تە یە
ئەڤ بەگۆ ئاغانە یە کەسەر تۆ سپارتی دژمنان
گەه بجیرنی ئەو دخون مالێ تە یان بگازندە یە
ماچیە کۆ چارەکێ تو ژێ بسەر بەستی بڕژی
حەیف و هەوار خوە تۆ بستینی ژ خوین میرژی خوە یە
((دێرشەوی)) هەردەم دمینالی وەلاتێ چە گەرچویی دلبرین
ئەوپەرێ شانۆ بەلەنگازێ تم کۆ خەندا ری تە یە

-١١-

ئەی هەڤالێن دلۆڤانان: باوەر بکن ژ یەزدان
هەر بەزم ییێ کولۆڤانان: سەر خاکێ کوردستان
مەگو تبەلکی ببینم: دەرمانەکی ژ کوللارە
بریناێ بکەوینم: بەلێ لمی بۆیە فەرمان
مەگو ئەمێ بستینن: دەستۆ چیا چارەک
ئالا کوردی بهەژینن پاشێ مەزۆرا ل دەردان
گەلێ کورد دەرابن: پێکڤە بکن خەباتە
هەمی ئێکگرتا بن: بەس بمینن لەردان
ڤا یە هاتە مەیدانێ: خۆرتێ کوردێ قەهرەمان
رۆژا جەنگێ لێدانێ: نە فەر حەمزێ پەهلەوان
وەلاتێ خوە بستینە: تو چارەکێ بتەمامی
نەیارێ دەربینە: پاقژ بکە کوردستان
نەیارێن تەیێ عەول: هەمی بەگۆ ئاغانە
بکوژە ژوان ئێک تۆ چل: ژبۆ دل هەر ئەو دەرمان
هندەک هەنە ژوان ژی: خودان دەهۆ غیرن
ئەو ژی فەقیر د ژییە: بدل دبێژن ئەم موسلمان
(دێرشەوی) تم دنالی: ژبەر ئێشا برینا
هەردەم بقیرۆ کالی: کالا وەلاتێ کوردان

دوهوی نیڤرۆ ژ بەری نڤێژا ئێڤاری

م جەمشەکەی سپی دەشتێ طاری

م گۆ چ دکی لڤێ ئەی جەمشێ نەزان

طری گۆ ئەز دگەرم ل طایێ ئێڤاری

م گ[illegible] جەمش[illegible] چی [illegible]

[illegible]

د[illegible]تی ی دگەر[illegible] ل بەر رویبارێ

م گۆ ئەی ئەری تەن ژ بۆ چی

دچی بۆ تێ دگەرهی ل بەر رویبارێ

ئەری ماناکی پاکی ژ دور ژ مێنی حوە

وەمو د تو ژ بۆنا حوە نەیاری

تۆ نابینی ل دۆرتە ل دور تە والێ کۆچا و ا گورگا گرتیە ب چار کەناری

دگۆ ئەڤ گورگێن هەراست لمن یەیارن

بەلێ ژ من پێدا هەنە جەمشێن سێ صالی

م گۆ ئەی کەر ژ تە جەمشێ چی تە بانە

دگو هات حەچی خانی و بفرو شێن ڤی واری

م گۆ ئەی جەمشێ هەمی ئاغاوەسان؟

دگۆ تە من پورێن وان ئەهلێ پاری

م گۆ ئەی تو نابێژی ژ بۆ وان

کۆ بێینە دور ژ بن باری نەیاری

دگۆ تە من چیە لسن بۆی جەگەرخوین

ژ صبها لمن گازندە تا ئێڤاری

ئەرێ دەردێ کەراما تۆ نزانی

لباصور گول تە ب یەک طا ڤیڤاری

بەگ و ئاغا چ زانن قیمەتێ کورد

واکوردستان سپارتیە بۆ نەیاری

حەچی گاڤا ژ هوێت رەبێتە فیتەک

ئەوێ هەرنشتی بدنە ب یەک دیناری

م گۆ ئەی جەمشێ موو دیکی بەکی بێژنە

تە جەرگێ من ژ دل کر پاری پاری

دگۆ ئەی (دێرشەوی) بەس تو بنالە

تو بەس بگری بقیرینو هەواری

١

ژ من باوەر بکە دلبەر :: ئەڤیندار بەنەقۆ دل
کوکوڤان هەرویە کەر :: لباغێ کۆمێ وەک بلبل
ژگوڤانا دنالم ئەز :: وەکی ڤێندێ دسۆژم ئەز
وەکی بلبل دکالم ئەز :: گاڤا لمن بەرزە بت صۆل گول
گاڤا صۆرگول لمن نەدیار بت :: چ رەنگ دێ من خوەشی لکار بت
خەو و خوارن دێ وەل مار بت :: ژ بەر رویێ لەعلا روی صۆرگول
ئەوە لەعلێ دورۆ یاقوت :: دلۆ جەرگێ هناڤ لمن صوت
وەرە ئەی دۆستدا ئەم پێن مزوت :: گولۆ دهەڤدا راکین ژ سەر دل
وەرەدا ئەم کولا راکین :: گولۆ بلبل بهەڤ شاکین
ب بینا ب رۆندکا سا خکین :: مە ئێژن مارتن بریێ بۆن چل
برینێن من ب ئێژنمارێ :: ب بەجیێ بژانێن پر غەدارێ
لێ ژەحرە خەو و خوارن :: جڤاڤا تە لێ ب کول
جڤاڤا تە کولە لباغێ :: تو وی خەونو خیالا من
ئەڤینا تە ئۆ صیدالی :: دل ئەسیرێ خوەڤەکی تو دل
بەسە دلبەر ئەڤێ خەشمێ :: (لدێ شەهێ) بکە رەحمێ
دەرینەوی ژ بێ زولمێ :: ژکولۆ دەردا لوی ب سل ::

٢

ئەو دلبەرا من دل لبال :: هاتو سەلاڤ لمن کر کەن
ب کر لمن دوردو خیال :: کر ئەڤ سەدلۆ سەکێ
ب سیار ژ تە ئەی بلبلێ خۆن بوی :: چ گەر ژ دەردێ ئەڤی
ئا تە هەیرە چێ بۆیە؟ یا هێژ تو دل کول وەلد می؛
حادر دامن ئەڤ جەواب :: دل خەبتێ ب رەنگێ رەهاب
ماچەت نیە صۆندێ بخوم :: چونکی ئاگەهداری ب منێ
صۆنت دخوم ب رەش ئەبروا :: خەمسە ئەماشیێ روا
ئەو کو صەدل ب پارە پار :: چونکی تو خوەشی کیژا منی
دل لمن دنالت رەنگی :: چەنگ جەرگێ هناڤ لمن پورگ
تەشبیهێ فرهاد دل بکول :: چونکی شیرین نامنی؛
شیرینێ توی فەرهاد ئەزم :: ژ دەردێ ئەڤینا تە دگەزم
بوات هەردو لدم وەعە بینا :: دناڤ زانم تو خوەشی زینامنی
تە دین کرم شبهێ مەمی :: دەردلی جڤینە هەردەمێ
گوندا دریژشەوی ئەبەس تو بنال :: زانم ئەڤینداری منی .

-٢-

وەی دلبەرێ وەی دلبەرێ
وەی شیرینێ لێ شەکەرێ
ئەز ناگرێ لجەرگێ [illegible] مدا
ماچەرەگێ ناقەمرێ؟!

دلبەر تووی دلدار ئەزم
سۆرگول تووی بولبول ئەزم
کەیف خۆشی تووی دلکول ئەزم
رەحمێ ببە ئەی سەروەرێ

رەحمێ ببە ئەی نازەنین
فەرسۆ وەرە حالم ببین
جەرگۆ هناف لمن بۆنە خوین
وەی دل رەقێ دل کافرێ

وەی دل رەقاش رەنگێ بەرا
بەس من بدە لبەر فەنجەرا
من دل نەما ژبەر کەسەرا
ماژ خوە تو نابێژی ئەرێ

دەرد و کەسەر پور بۆن لبال
کەیفۆ خوەشی لمن بۆن خیال
ئەز بۆمە کوردەک بێهەڤال
وەی کوردستانا بگەوهەرێ

کوردم کوردستانا منی
شیرینۆ هەم ژینا منی
هەم دەشتۆ زۆزانا منی
دێ دژمنان ژێکم دەرێ

بۆ دژمنان ئەز رێگرم
ئەو دەستێ پێ تە دبرم
لسەر سنگێ تە بالەفرم
وەی شیرینێ سوعتە بەرێ

سنگێ تە مەیدانا منە
هەم باغۆ بویستانا منە
جهێ گەشتۆ جەژنا منە
روی سۆرگولێ دیم گەوهەرێ

«ئیرشەوی» هەردەم مەرەق لێ‌شە ببۆست دیلبەری
دابێت قور بانۆ گوری ئەو رەمۆ جانو لاخشە

---

٦

ئەری دیلبەر ژبۆ یەزدان دلێ من ئەڤە تو بشکینە
تو زانی ئەز برینداریم برینێن من نەهەرشینە
گولۆ دەردۆ خەما هەردەم دلو سێلالا لێ صوتن
ژمن باوەر بکە دیلبە ژبل تە من ئومێد نینە
مەزانی تو ئەڤیندارێ وەکی من دل برینداری
بەلێ دەرکەت وەکی ماری تە بەخت ئینصاف قەت نینە
تە گوت بۆ تە مووەشی هەخالم ژ ئینا تەوولات مالم
تە نە گوت ئەز کە رۆلالم مەگری و گازندگولێ نینە
بەسە دیلبەر ژبۆ یەزدان لدێ شەوی ڤەکەڤەیان
ژ کولو قەهرو خەمو دەردان دلو جەرگێ وی صوتینە.

---

٧

دیلبەر تو باوەر کە دەما کو ئەز تە نەبینم
بێ سەوداو دینم
شەب تا سەحەر ئەز کولۆ دەردا دچینم
چونکی دل برینم
دەردو کەسەرا جەرگۆ هناڤ لمن کر پارپار
ئەز مام بێ تەسۆگار
وەک کوردەک پەریشانو بە لەنگازو بێ سەردار
ڕێگا دکوڕینم
بۆ راندنە مە چەند صال و زەمان بژارد بە لەگاز
گازادی مە داخواز
ئومێدا مە رزگار ببین را بڕێن بسەرفراز
دەردا خەرەڤینم

-٨-

ئەری دیلبەر دەکا بێژە ژ بۆچی تو لمن نەدیاری
تە ئەڤ دنیا هوە شۆ شیرین لمن کر دوژەهەک طاری
حەتا کەنگی بمینم ئەز د بەندا سوز و بەیمانا
ئەڤە روژ ژ ئەمری نیڤرو نەمابیت چاضی ئیشاری
مەبوژ رابند سهوژ چار صال د ریکا بورجوکا راینی
ژ نو پێڤا دبێژی من عەرەبی لڤی جهو واری
ئەگوریسا خێم هەلوبەلا لێ ئەمیر و شێخو قازی ئە... ١٩٦٢ دا هوە
لباسە یدا لسەرای ئەم بین میهڤا بر ژکاری
جەواب و کاغەز اریکین دگەل خانی بلاکوم کت
جەزیر و میر عمادالدین دگەل وان برتو وی هەکاری
(فەقی سەیدا) هەریی تو بنالینە وەکی (نالی)
(جەگەرخوین) بژووەکی (نال بەند) لەژین بوو وەکی ماری
(شڤان) بێژە کوری (...) تو کاک و قانونی فو بینە ...
(سەعید آغا) (جزیری) تو ... دبادی کە لها گا باری

ش

ئەگوت بوتە ئەڤیندارم برەنگو زنی... شرینی
حەتا بوم بلبلەک شەیدا ژ نو دبیژی ساز کاری
وەرن داهوین کول و قەهر و فەموژ دەردا تەغاراکن
خوەشی و شاهی دەولەتێ مە سەرانسەر بت بیەکجاری
دگو فەرنامەی و دیلبەر نەمینت ژاری و برسی
حەتا کەنگی خوەشی ببم تاکو دگەل یاری بکم یاری
دەماژ برجانە ... تێم حەمی پێکڤە بیەلک دەنگی
بێژن دێرشەوی بەراستی ئەڤیندار ئەڤینداری

---

ئەگەر چیکی ژ بو جمعێ کە رێرا — عەزیز ئاڤ ری دنیڤ دیوان کەمرا
تووی ئاڤ دی ژ یێنبوع هەیاتێ — دستونا جەهـ بدی وی لوژ و خوەرما
مربی تێ بکت بوری افلاطون — معلم بی ژبووی ابن سینا
هەمی تە صدیق بکن دبلو میاوی — ژ هەر صنفی ژ صنفێ اهلێ علما
هەکە باوەر کوتە و صاحب هنر بە — تەوێ دیسا دەبی باخێ خوە لەربە
دەما تو دی ژ تەبوای دەربی — هەز ... نائی ژ غەیری وێ ضرینی

٨

ئەز كوردم موسلمانم ∴ وەلاتێ من كوردستان
شۆرەشگێرەك جوانم ∴ ئەز عەگید و پەهلەوان
سەروەرێ من پێغەمبەر ∴ والاتێ من كوردستان
هەر لەوە بۆ مەرتبەر ∴ ئەز عەگید و پەهلەوان
سەرباڵێ دۆژمنێ ∴ وەلاتێ من كوردستان
بۆ ریگاوی گورىمە ∴ ئەز عەگید و پەهلەوان
دڤێت كو ئەم گشتی رابن ∴ وەلاتێ مە كوردستان
[illegible]
داخبن زولمێ روزگارێ ئاتەرف عەگید و پەهلەوان
ئامانجا مە دڤێت سەلامەت بن ∴ وەلاتێ مە كوردستان ؟
داكۆكی ژ مە ... تەمامی ∴ ئەز عەگید و پەهلەوان
«دێرشەوینێ» دلبرینم ∴ وەلاتێ مە كوردستان
تم بقیر و نالینم ∴ ئەز عەگید و پەهلەوان

---

٩

ساقی تو ژ بۆ خودێ بەلەزینە
[illegible]
هندەك ژ مەیا صافی تو بینە

هەرچەندە مە طاقەت نینە بشەرابێ
چونكی دمە رۆنە بدەنگێ كتابێ
ئەمڕۆ دا وكو ئەز ژی بێژم
هەرچی لدلێ خوەدا بڕێژم
مینا مەزنێ مە شێخێ خانی
وی هەسپێ بەلەلێ بدمەیدانی
پۆر پۆرێ بكم بدل صەوارژی
ژنی چەرخا لەتم خوە هەروقارژی
پرسیارێ مە هەردەم ژ لەولە باچەرخ
تاكە نكێ جیران لمەگورن ئەم بەرخ
سكینو چەقۆ لسەر صلوێ مە
هەر كەبەرێ وی لناگۆشتێ مە
هەردەم وەكی هرچۆ گورنە باشا
هەشیال مە خەهێزێ ئەوئەلی باشا

-١٢-

دەنگی

بەسی تو بنالە ئەی کورد بوی خوەیێ زار

پەهیز لتە خلاسی بێ ڤایە لتە بێ بهار

هشێ بوّ ئەو دارا کوّتە ئاڤ رای بگولە خوینا مە

پیرۆزان بکەو ب حەمینەدا هشیارنجی دەدا هەرجار

فیکلیێ خەباتاتە یە روّژا یازدەی ئاداری

دەلدنێ خوە لناڤاکە ژبیرکە تو پاروپیوار

کوردستان تە ئازاد کر ب خوینا رێشی شەهیدا

طوّپوّ تە لەسم بهە قرادگەل خوهرا نا جوّشیار

ئەی ئادارێ زانم چە ژناکوردان :: ب خوینا خوڕتێن خوە هەتو
زانین. هژ بابەت هاتی تازەنیم :: کو خوەکێ هەڤالێ پارتو با
ژبەری کو تو بۆ لسەرکوردستانێ :: بچیە دبارین وەکی بارانێ
لێ مللەتێ کورد وەکی لسەیرانێ :: چونکی لدو هەب پارتو بارزانی..
هەڤال ذبیرنەکی کو شتێن لکوردستانێ :: خوە کرنە گوری ژبو ک
داوەلێت دەرخی ژبن بێ وەدەستانێ :: ب کاریگاریا پارتو بارزا
دایکا شەهید هەرە بلزینە :: کوشتیا ب جادەلی تەڤا بچینە
بێژە کوڕم ئەم نەبی خوەینە :: ڤایە مە هەیە پارتو بارزانی
بژی هەڤالێ مە ئەحمەد بەکر :: براستی دلێ مللەت لخوە خوش کر
یازدەی ئاداری تازە وی دەرکر :: ب کاریگاریا پارتو بارزانی
((دێ شەوی)) نەگری مللەت شیار بو :: دەمێ تارو تەنگ کو مە دیت ڤا. چو
ریکا زینا خوە وی گرتو ڤاچو :: لبێ شیادی پارتو بارزانی

# ناڤەرۆك

